ڕووی هەموو کەموکورتیو ناتەواوییەکانی کۆمەڵ ڕامالیوە. لە کۆمیدیادا گوایە دەچێتە جیهانی پاش مردن و سەرەتا دەگاتە دۆزەخ. لەیەکەم سروودی دۆزەخەوە دانتێ کەوتۆتە پەلاماردانی ئەو پاپاو کاردینال و قەشانەی لەژیانیدا خراپەیان کردووەو نوشتەی تاوان ڕەوێنیان فرۆشتوەو خزمەتی نیشتمان و گەلیان نەکردووە. ئەوانەی بەچاویرسیو خۆفرۆش ناوی بردوون و لە ڕیزی دزو جەردەو دلڕەقانی جیهاندا دایناون و سەرەو ژێر هەڵیواسیون و ئاگری دۆزەخی بۆ کردوونەتە لانەی هەتایی. لەسرووودی نۆزدەمینی دۆزەخدا, بەوێنە, توشی پاپا بۆنیفاتشۆی هەشتەم دێو بێ سڵ کردنەوە بە تاوانبارو بەرتیل خۆرو خائین و جەردەی کلێسەو دوژمنی نیشتمان ناوی دەبات, بۆنیفاتشۆ لای دانتێ "پەڵەی شەرم و نزمییە بە ناوچاوانی سەرتاپای مرۆڤەوە". دانتێ تەنانەت ئاشکرا ناوی کلێسەش دەباو لەسروودی سیودووەمینی ئەعرافدا ئافرەتێکی خراپی کردۆتە دروشمی.

"کۆمیدیای یەزدانی" بە تەرازوویەکی ورد زۆربەی گەورە پیاوانی کلێسەی نرخاندووە, کەمترین چاکەی بۆ تۆمار کردوون و پاداشتی لەسەر داونەتەوە, بەوێنە ئەدریانی پێنجەمی لە (ئەعراف)دا لە نزیک بەهەشتەوە داناوە[113] , تەنها لەبەر ئەوەی بۆتە پاپا ئیتر دەستی لە بەخیلی هەڵگرتووە و دڵسۆزانە ئەرکی سەرشانی جێبەجێ کردووە.

هەمان کات کە دانتێ پاپاو قەشە خراپەکانی بێ بەزەییانە بە ئاگری دۆزەخ دەسووتێنێ و شاعیرو نووسەرە بت پەرستە گەورەکان دەنرخێنێ و بەچاوی ڕێزو خۆشەویستیەوە سەیریان دەکا، ئەوانیشی لە ئەعراف لە نزیک بەهەشتەوە داناوە، لەگەڵیان دەدوێ، یادی خزمەت و چاکەکانیان دەکاتەوە لەوەیش زیاتر، ڤێرجیلی ناوداری کردۆتە ڕێنومای خۆی. بە جووتە پێکەوە ئەعراف دەبڕن، ڤێرجیلی شاعیری بتپەرستی ڕۆمانی کە ساڵی حەفتای پێش زایین لەدایك بووەو ساڵی نۆزدەی پێش زاین کۆچی دوایی کردووە، پیاوێکی زاناو داناو هەست ناسك و شەرمن ، نموونەی ڕەوشت بەرزی و دڵسۆزی بووە. لە بەرهەمەکانیدا لەهەموو شت زیاتر بایەخی بە مرۆڤ داوە، باسی جوتیارو شوان و کچە لادێی و جوانیی سرۆشتی کردووە. ڤێرجیل

---

[113] لەسرووودی نۆزدەمینی ئەعرافدا ناوی هێناوە.

نیشتمان پەرست بوو، خۆزگەی بەو رۆژانە دەخواست کە رۆما تیایندا بەهێزو یەکگرتوو بووە ئەوانەش بەس بوون بۆ ئەوەی ڤێرجیل لە زووەوە سەرنجی دانتێ رابکێشێ. بەڵام دانتێ لەو هەڵبژاردنەیدا مەبەستێکی تریشی هەبوو، ڤێرجێلیش وەك رووناکبیرانی رۆژگاری رێنیسانس لە قۆناغێکیدا دەژیا رۆژی نوێ لەکەلەوە سەری دەرهێنا بوو. ئەویش وەك ئەوان، عەودالی تەوژمی گۆڕان بوو.

لە سێیەمین سروودی ئەعرافدا ناوی پاتریس بۆرتیناری دێتە ناو کۆمیدیاوە، لەوەدا دانتێ وردەکارییەکی هونەرمەندانی کردووە، چونکە بەو پێیە پاتریس لە 30 سروودی ئەعراف و لە 32 سروودی دۆزەخدا ناوی نییە کە تێکڕا دەکەنە 63 کۆی سێ و شەشی دەکاتە نۆ. بەهەمان دەستوور پاتریس لە 3 سروودی ئەعراف و لە 33 سروودی بەهەشتدا، ناوی هەیە کە پێکڕا دەکەنە، 36. کۆی شەش و سێش دیسان هەر دەکاتە نۆو دانتێش، وەك باسمان کرد، لەتەمەنی نۆ ساڵیدا بوو کە پاتریس بۆ یەکەم جار تەلی دڵی توند هەژاند. دوای ئەوەی دانتێ لەدوا قۆناغی ئەعرافدا تووشی یەکەم خۆشەویستی ژیان دەبێ ئیتر ئەو دەکاتە رێنومای و لەگەڵی دەچێتە بەهەشت. هەرچەندە، بێگومان، خۆشەویستیی رەسەن هاندەری یەکەمی ئەو هەڵبژاردنەی پاتریسە، بەڵام هەمان کات گومان لەوەش ناکرێ کەدانتێ بەو کارەی دەیویست نرخی بەرزی مرۆڤی هاوچەرخی خۆیو هەستی رێزی بەرامبەر ناوەرۆکی ئاینی عیسایی دەربڕێ چونکە لە راستیدا دانتێ بە هیچ جۆر دژی ئاینی عیسایی نەبوو بەڵکو دوژمنی باوەکوشتەی ئەوانە بوو کە رووی راستەقینەیان شێواندبوو، ئەوانەی لە ژێر پەردەی ئایندا ئەوی نەدەشیا دەیانکرد.

لەدوابەشی"کۆمیدیای یەزدانی"دا دانتێ بە شێوازێکی دڵڕفێن باسی بەهەشت دەکات. بەهەشتی کۆمیدیا جێگەی رەوای دڵسۆزان و نیشتمانپەروەران و پیاوچاکانە، جێگەی ئەوانەیە کە لەژیاندا ئازاری کەسیان نەداوە و لە چاکە و دڵسۆزیو خزمەتو خۆشەویستی بەولاوە شتێکی تریان نەزانیوە.

دانتی ئەلجیری نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز بوو، ئەو دەیویست ئیتالیا یەکگرتوو، بەهێز و خاوەن دەسەڵات بێ. هەر کەسێك رۆژێك لە رۆژان خزمەتێکی ئیتالیای کردبێ ئەو ناوی لە کۆمیدیادا هێناوە. هەر بەوجۆرەش زۆر بەتوندی رەخنەی لەباری سیاسی ئیتالیای سەدەی سیازدەمین گرتووە. بەجۆرێك دەیویست سەرنجی پێ

رابکێشێ و هەستی پێ ببزوێنێ. ئەوەتا لە سروودی شەشەمینی ئەعرافدا ڤێرجیل و سۆردیلۆی شاعیری کۆنی رۆما یەکتر دەبینن، هەر کەناوی نیشتمان دێ هەردووکیان بەگەرمی باوەش بەیەکدا دەکەن[114] . کاتێک دانتێ بەو جۆرە دەیانبینێ ماتەمینی دایدەگرێ چونکە پارچە پارچەیی و رەشبگیریی نیشتمانی بیردەکەوێتەوە کە "بۆتە کەشتییەکی بێ کەشتیوان لەناو زریانێکی پڕتەوژما". "یاسا چ دادێک دەدا ئەگەر کەشتییەکە بەدەست سەردارێکی لێهاتووە نەبێ؟" دوای ئەو پرسیارە دانتێ بەچاوی پڕ فرمێسکەوە روودەکاتە قاپیی خواوەندی مەزن، دەیەوێ بزانێ چاوی رەحمەتی لە ئاستی نیشتمانی خۆشەویستیدا توقاندووە یا کاری خێری بەدەستەوەیە بۆی. هەرلەوێدا دانتێ دەکەوێتە لۆمەی فلۆرەنسە کە "عەدالەت تێیدا تەنها لەسەر زارانە"، کە دانیشتووانی کوژراوی پارەی مفت و پایەی بەرزن. ئەی ئیتالیای خۆشەویست "رۆڵە زیندووەکانت کە وان لەناو یەك دیوارویەك سەنگەردا دەست لە کوشتاری یەکتر هەڵناگرن. یەکتر لەت و کوت دەکەن"!. ئەی ئیتالیای کڵۆڵ "بڕوانە رۆخی دەریاکانت و ئنجا بڕوانە سەر سینەت بزانە لە هیچ قوژبنێکدا تروسکی ئاشتی بەدی دەکەیت؟".

نتێ باش لەوە گەیشتبوو کە رەوشت بەرزیی مەرجێکی بنەرەتی سەرکەوتنی کۆمەڵە. لەبەر ئەوە عەوداڵی مرۆڤی نموونە بوو. دیزانی " هەزار ساڵ ژیان لە ئاست ئەمریدا تروکەیەکە، ناوداری و شۆرەت چەشنی گیا سەوز دەبێو زوو وشك هەڵدێ" (سروودی یازدەمینی ئەعراف) . بۆ دەربڕینی ئەو مەبەستە بەرزەی دانتێ گەلێك نموونەی جوان و مانادری لە "کۆمیدیا یەزدانی" دا هێناوەتەوە. وەك بەڵگە ئەم دوو نموونەیەی سروودی یازدەمینی ئەعراف دێنمەوە:

لەپڕ ئافرەتێکی ترم بەدی کرد، فرمێسکی خەفەت و
توورەیی جۆگەی لەسەر گۆنای بەستبوو.
رووی دەمی تێ کردو ووتی:
"ئەگەر تۆ سەرداری ئەو شارەی کە خواوەندانی
-کۆن- لەسەری پەلاماری یەکیان دا، ئەو

---

[114] هەردوو شاعیری رۆمای کۆن ڤێرجیل و سۆردیلۆ خەڵکی شاری مەنتوا بوون.

شارەی تیشکی هەموو زانستێکی لێوە دەدرەوشێتەوە.
ئەوا، ئەی پستراتۆس ، تۆڵە لەو دوو
دەستە چەپەڵە بسێنە کە بە ئاشکرا لە
گەردنی کیژۆڵەمان ئالآن".
ئەنجا ئەو سەردارە ئاسکەم بەدی کرد. بە روویەکی
خۆشەوە پێی گوت:
"جا ئەگەر ئێمە سزای ئەوانە بدەین کە خۆشیان
دەوێین ئاخۆ دەبێ چی لەوانە بکەین کە رقیان
لێمانە؟".

بەو جۆرە دانێ یەکێك لە داستانە یونانییە کۆنەکانمان بۆ دێنێتەوە. گوایە لاوێك لە یەکێك لە شەقامەکانی شاری ئەسینادا ئاشکرا پەلاماری کچی سەرداری ئەو شارە پستراتۆسی[115] دواوەو ماچی کردووە. شاژنیی دایکی شێتگیر بووەو پستراتۆسی هاوسەری هانداوە تۆڵە لەو لاوە بسێنێ. ئەویش لە وەڵامدا بە هێمنی پێی گوتووە.

"جا ئەگەر ئێمە سزای ئەوانە بدەین کە خۆیشیان
دەوێین ئاخۆ دەبێ چی لەوانە بکەین کە رقیان
لێمانە؟"

**نموونەی دووەم:**

ئینجا دەستەیەکم دی خوێن لەچاویان دەباری،
بەردەبارانی لاوێکیان دەکردو بە تووڕەیی هاواریان
لێك دەکرد.
با بکوژرێ ، با بتۆپێ...
ئەویش لەژێر زەبری مەرگدا بەبەر چاومەوە دەکەوت ، بەڵام
تادوا هەناسەی چاوەکانی بڕیبووە ئاسمان... لەیەزدانی
بەرز دەپاڕایەوە لەوانە خۆش بێ کە بەردەبارانیان دەکرد"

[115] ئیمپراتۆر پستراتۆس لە نێوانی 605و 572 ی پێش زاییندا فەرمانڕەوایی کردووە.

بەو جۆرە دانتێ باسی کوشتنی ستیڤانمان بۆ دەکات یەکێك بوو لەسەرداره ناودارەکانی ئاینی عیسایی. ستیڤان کاتی خۆی ڕەخنەی لە چەند لایەنێکی ئاینی مووسایی گرتووەو دەستەیەك جوو لەسەر ئەوە بەردبارانیان کردووەو ئەویش لەخودا پاڕاوەتەوە و لێیان نەگرێو بیانبەخشێ.

لەوانەیە لەو بۆچوونانەی دانتێدا زێدەڕۆیی ڕۆمانسی هەبێ. بەڵام گرنگ مەبەستی بەرزییە کە هەمیشە چاکە بەلایەوە چاك بووە . سەرتاپای ڕەخنەو ستایشەکان لە جێگەی خۆیاندا بوون. دانتێ تەنانەت ڕەخنە لە خۆشی دەگرێ. لە یەکەم دەیدەنیدا پاتریسی خۆشەویستی لێی دەپرسێ ئاخۆ دوای مەرگی ئەو هیچ خۆشییەکی ژیان سەری لێ شێواندووەو ڕێگەی ڕاستی لێ ون کردووە. ئەویش لە وەڵامدا دان بەوەدا دەنێ کە "دوای ون بوونی ئەو" جاروبار پێی هەڵنوتوە!.

دەریای بێ بنی "کۆمیدیای یەزدانی" سەرتایەکی بێ کۆتاییە . ڕشتەی مراوارییەکانی ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دەدرەوشێنەوە. کۆمیدیا وەستایانە نابرووی کۆت و زنجیرە ڕەشەکانی سەدە ناونجییەکانی بردو چرای بۆ ڕزگاری و سەرفرازی و ژیانی نوێ هەڵکردو لەوێوە بەرەوپێش بە گوڕو پاڵی بەرەوڕەوەی مێژووەوە نا. وەك — گرانت-ی مێژوونووسی ڕۆژئاوایی دەڵێ کۆمیدیا بەڕاستی "ئاوێنەی سەرتاپای زانست و هەست و خواستی" چەرخی خۆی بوو[116] . مەبەستی بەرودای کۆمیدیا مرۆڤ و نیشتمانە. لەبەر ئەوانەشە "کۆمیدیای یەزدانی" بۆتە بەرهەمێکی نەمرو جێگەی ڕەوای بۆ خۆی لە قوڵایی دەروونی نیشتمان پەروەران و دڵسۆزان و زانیان و هونەرمەندان و ڕەمەکی ڕووناکبیرانی وڵاتە پێشکەوتووەکاندا کردۆتەوە. سەدان ساڵە بۆتە یەکێك لە هاندەرە گەورەکانی شۆڕشگێڕانی ئیتالیا. هونەرمەندێکی لێهاتووی وەك فرانسۆ ڕۆدان (1840-1917) دوای سیو حەوت ساڵی ژیانی بۆ دروست کردنی پەیکەری "دەروازەی دۆزەخ" تەرخان کردو کەوێنەکانی لە کۆمیدیاوە وەرگت و ئینجا فریاش نەکەوت تەواوی بکات هاوڕێ و شاگردەکانی بۆیان تەواو کردو ئێستە مۆزەخانەی —ڕۆدان-ی لە پاریس ڕازاندۆتەوە. تەنانەت هیتلەریش شانازیی بە دانتێو بەرهەمانییەوە دەکردو دەیویست بیانکاتە بەڵگەی سەلمێنەری بەرزی ڕەگەزی ئاری.

---

[116] A.J Grant, A history of Europe, part II Middle Ages, London, 1929 . p. 464.

شایانی باسیشە دانتێ بۆخۆی ئەو بەرهەمەی ناونابوو "کۆمیدیا" . بەڵام نووسەرانی دوای خۆی وەك نیشانەی جوانیو تەواوی وشەی یەزدانییان پێوە لکاندووە.

لە رۆژگاری (دانتێ)وە رووناکبیران روویان کردە کۆمیدیا و کەوتنە روونووس کردن و بڵاو کردنەوەی . زۆری نەخایاند کاتێك رووناکبیرانی دەرەوەی ئیتالیاش قۆستیانەوە دەستیان دایە وەرگێڕانی. هەمان کات "کۆمیدیای یەزدانی" یەکێکە لەو بەرهەمە ئەدەبییانەی چاپخانەکان لەگەڵ داهاتنی چاپی نوێدا کەوتنە چاپکردنی. ساڵی 1472 واتە پاش ماوەیەکی زۆر کەم لە دۆززینەوەی چاپی نوی لەلایەن (گۆتێنبۆرگ)ەوە، کۆمیدیا بۆ یەکەم جار لە مێژوودا چاپ کرا.

بێگومان ئەوانەی باسمان کردن وانا گەینن "کۆمیدای یەزدانی" یا بەرهەمانی تری دانتێ هیچ کەم و کورتییان نییە. زۆر مەبەست و ئامانج هەن دانتێ تەواو نەی پێکاون. بەوێنە بە لای ئەوەوە زانست و بەرزکردنەوەی ئاستی بیر، تاکە رێگەن بۆ جێ بەجێکردنی بەختەوەری و سەرفرازی بۆ مرۆڤ. ئیمپراتۆری رۆمانی کە لە پەل و پۆ کەوتبوو لای دانتێ " گەورەترین هیوای جیهانی عیسایی بوو".

دیارە ئەو جۆرە کورت بینییە ئاساییانە بۆ رۆژگاری خۆیان ناتوانن هیچ لەپایەی یەك جار بڵندی دانتێو بەرهەمەکانی کەم بکەنەوە. بەتایبەت ئەگەر ئەویش لەیاد نەکەین کە نە ئەوو نەکەسی تری وەك ئەو ئەساکە نەیاندەتوانی خۆیان بە تەواوەتی لەدوا تاڵەکانی سەدە ناونجییەکان رزگار بکەن. وەك ئینگڵس دەڵێ پێویستە ئەوەمان لە بیر بێ کە دانتێ وەك چۆن یەکەم شاعیری چەرخی نوێ بوو هەمان کاتیش دوا شاعیری سەدە ناونجییەکان بوو. مێژوونووسیش هەن پێشنیار دەکەن "کۆمیدیای یەزدانی" بکرێتە هێڵی نێوان ئەو دوو چەرخەی مێژوو[117] . هەرچۆن بێت نەمریی دانتێ لەوەوە هاتووەکە ورد لە ئەرکەکانی قۆناغ تێگەیشت و دڵسۆزانە رەفتاری لەگەڵ کردن و چارەی رەوانی بۆ دۆزینەوە. لەوەوە هاتووە کەدەمیزانی (هەزار ساڵی ژیان لەئاستی نەمریدا ترووکەیەکە)

---

[117] بەوێنە بڕوانە:H.B Cotterill, Op, P,494

## سەرەتا.

لەبەرایییدا باسی باری ژیانی ئەوروپا و کێشەکانیمان لە کۆتایی سەدە ناونجییەکاندا کرد، لەوێدا دیمان چۆن رژێمی دەرەبگی بەگشتیی‌و کلێسە و پیاوەکانی بەتایبەتی بووبوونە بارێکی قورس بەسەرشانی کۆمەڵانی خەڵکی وڵاتانی ئەوروپاوە. بێ لابردنی ئەو کۆسپە رەورەوەی مێژووی ئەو پارچە گرنگەی جیهان بە هیچ جۆر نەیدەتوانی بەرەوپێش بڕوات. بەشێکی زۆر لەئەرکی تەخت کردنی قۆرتە گەورەکانی ئەو قۆناغە کەوتە ئەستۆی پێشەنگی دەستەی رووناکبیری ئەوسای ئەوروپاوە. وەك گوتمان یەکەم ئەدیبی لێهاتوو کە ئەو ئەرکە پیرۆزەی گرتە ئەستۆ دانتێ ئەلجیری بوو. زۆری نەبرد دوو ناوداری تر دیسان لەفلۆرەنسەی ئیتالیا هاتنە ئەو کۆڕەوە کە دانتێ یەکەم ئاڵای سەرفراویی نوێی تێدا هەڵکرد.یەکەمیان پێترارك و دووەمیان بۆکاشێو بوو.

## فرانچیسکۆ پێترارك
## با جەنگاوەریی جارا نمان زیندوو بکەینەوە.

شوێنی پیترارك لە ژیانی رووناکبیرانی ئەورووپای کۆتایی سەدە ناونجییەکاندا هێند دیارو گەورەیە وای لە زۆر مێژوونووس کردووە نازناوی "باوکی رێنیسانس "ی بۆ هەڵبژێرن. گەر پیترارك دروست لە ئەرکەکانی قۆناغ تێ نەگەیشتایە و دڵسۆزانە بەدوای دەرمانی نەخۆشیەکانیدا نەگەڕایە هەڵبەت شیاوی ئەو شوێن و پایە بەرزە نەدەبوو.

رۆژی 20ی مانگی تەمووزی 1304 فرانچیسکۆ پیترارك ( Francesco Petrarc) لەناو خێزانێکی بازرگانی فلۆرەنسەییدا چاوی هەڵهەڵێنا. وەك کاتی خۆی گوتمان بازرگانەکانی ئەوسای ئیتالیا لە هەموان زیاتر دژی رژێمی دەرەبەگی‌و

عەودالی لەناوبردنی کۆت و زنجیری ژەنگاویی سەدە ناوەنجییەکان بوون، بۆیەکا باوو باپیرو کەس و کاری پیترارك بە دەستووری دانتێ سەربە پارتی سپییان بوون. ئەوانیش لەگەڵ دانتێ بەر لەوەی پیترارك بۆخۆی لەدایك ببێت فلۆرەنسە دوورخرانەوە[118] . کەوابێ هەر لە کۆرپییەوە پیترارك بووە یەکێك لە قوربانییەکانی کۆن و کۆنەپەرستان. ئەوەی زۆر زوو لەهەست و نەستیا ڕەنگی دایەوە, لەتەمەنی دوانزدە ساڵییەوە پیترارك کەوتە خوێندنی یاسایی‌و ساڵی 1326 بووە فەرمانبەری کڵێسە . لە هەرمێتیی لاوێتیدا بەشارانی ئیتالیا و وڵاتانی ئەوروپادا گەڕا. پیترارك زۆر لە نزیکەوە تێکەڵێ خەڵکی ساکار دەبووە، جاری وا هەبوو بەرگی جووتیاری دەپۆشی‌و وەك فەلاحان دەچووە کێڵگەو ڕاوی لەگەڵ دەکردن، پیترارك بەشی زۆری ژیانی لەشاری ئەڤینیۆن بردە سەر کە ئەوساکە پایتەختی پاپاو مەڵبەندی گەورە پیاوانی کڵێسە بوو[119] . هەمیشە عاشقی بەرزیی ژیان وجوانیی سروشت بوو، کەم هەبوون بەرادەی پیترارك لەناوازی سات و سەمتوورو زیل و بەم تێبگەن بۆ خۆیشی ، وەك دانتێ لەهەندێکیاندا وەستا بوو.

خوێندن و کارو جۆری ژیان و گەشتەکانی فرانچیسکۆ پیترارك بۆی بوونە سەرچاوەی ڕەسەنی تێگەیشتنی لایەنی جیاوازی ژیانی گەل ونیشتمان. هەرزوو بیری وردی پاڵی پێوەنا بکەوێتە بەراوردێکی بەجێ و ڕەوا لە نێوانی ڕابردووی ئیتالیا و ڕۆژانی سەردەمی خۆیدا گەر بەر لە پەیدابوونی دەسەڵاتی فراوانی سەردارانی کڵێسە ئیتالیا یەکگرتوو، پێشکەووتوو، دەنگی زوڵاڵ بووبێت، ئەوا دیارە دەبێت لادانێکی گەورە بووبێتە کۆسپ و مەینەتی و دواکەوتنی گەل و نیشتمان. ئەو بۆچوونە هەستی سوراخی ڕابوردووی لەناخی دەروون و مێشکی پیتراركدا هەڵکەند. لەوساوە پیترارك دەستی دایە کۆکردنەوەو لێکدانەوەی پاشماوە دێرینەکانی نیشتمان، بەتایبەتی

---

[118] پاش دوو ساڵ پیترارك لە شاری ئارێتسۆ لەدایك بوو.

[119] لەژێر فشاری پاشایانی فەرەنسەدا پاپایانی کڵێسەی کاتۆلیکی لە مانگی مارتی ساڵی 1309وە تاوەکو مانگی کانوونی دووەمی ساڵێ 1377 بێ لە سێ ساڵی نێوان 1367 و 1370 لە بریتی ڕۆمای ئیتالیا شاری ئەڤینۆنی فەرەنسەیان کردە مەڵبەندی خۆیان، ئەو ساڵانە لە مێژوودا بە "دیلیی ئەڤینیۆن" یا " دیلیی بابل" ناودەبرێن.

دەستنووسی کۆنو کون و کەلەبەری ئیتالیاو ئەستەموول و دەرووبەریانی بۆ تەی کرد. بۆ خۆی نزیکەی 300 دەستنووسی دانسقەی کۆکردەوە کەهی وایان تێدا بوو کەس بە بوونی نەدەزانی. هەر دەستنووسێکیشی بۆ نەکڕدرایە یەکسەر روونووسی دەکرد. بەو جۆرە پیترارك کتێبخانەیەکی پێکەوە نا کە ئەوساکە لەسەرانسەری ئەوروپادا لە وێنەی نەبوو[120]. فرانچیسکۆ پیترارك زۆربەی ژیانی بۆ لێکدانەوەی ئەو دەستنووسانە تەرخان کردو هەر لەبەر ئەوەش لاتینییەکی عەنتیکە فێر بوو، بە یۆنانیشەوە خۆی خەریك کرد تاوەکو بتوانێت یەکسەر لە ناوەڕۆکی بەرهەمی فەلسەفی و رووناکبیریی گریکی کۆن تێ بگات[121].

پێوە لکانی بێ ئەندازەی پیترارك بەرابردووەوە کاریکی وای کرد ئەو لە دانتێ زیاتر بایەخ بە زمانی لاتینی بدات و زۆرتری پێ بنووسێت چونکە دەیویست، خۆی وتەنی، هەموو نووسەرانی ئەوروپا لە بەرهەمەکانی تێ بگەن[122]. بەلام ئەو بەرهەمانەشی کە بەزمانی زگماکی خۆی نووسیویێتی زۆرن و دەوریان لە دارشتنی ئیتالیای نویدا کەم نییە. لەهەردوو کیشیاندا، وەك دانتێ، مرۆڤی هاوچەرخ و نیشتمانی مەبەست بوو. پیترارك یەکەم کەس بوو وشەی مرۆڤایەتیی[123] لە رۆمانەکانەوە وەرگت و جێگەی دیارو شیاوی لە نووسینەکانیدا بۆ تەرخان کرد. مەبەستی بەراوردی پیترارك لەوەدا فوتارکردنی مرۆڤ و بەرلەهەموو شت بیری مرۆڤ بوو لەبەندو ئەسارەتی سەدە ناوەنجیەکان، چونکە باش دەیزانی بەبێ کارێکی گەوەری تریشی هەبوو، بەدەستووری دانتێ، ئەو جۆری مرۆڤ نەك وەجاغی مەبەست بوو. وەجاغزادەی رەسەن لای پیترارك ئەو کەسەی کە بۆ کارو پیشە و بیرو گەل و نیشتمانی خۆی دڵسۆزە.

---

[120] E.Welss , The Spread Of Italian Humanism, London , 1964, pp 24-26

[121] M.L. Bush . Renaissance , Reformation and the Outer world , London , 1964, pp 151 -152

[122] وەك لەبەرایيدا باسمان کرد ئەوسا هەموو روناکبیرانی ئەوروپا لاتینییان دەزانی.

[123] مەبەست (Humanisma) ە کە لە ( Humanitas) ی لاتینیەوە ئەویش لە ( Homo) وە وەرگیراوە کە مانای مرۆڤە.

فرانچیسکۆ پیترارکیش، وەك دانتێ، خۆشەویستی تێکەڵ بە شیعرەکانی کردو جارێکیتر سەلماندی کە ئەدیب دەبێت دووی کڵاوی بابردوو نەکەوێت بەڵکو ئاوازی خۆش بۆ ژیان بڵێت. هەر لەبەر ئەوەش شیعرەکانی پیترارك کە بەناوەرۆك و بە روخسار رازاوەو دەوڵەمەنــدن یەکسەر کەوتنــە ســەرزاران، هــەمووان بەپەرۆشــەوە دەیانقۆستەوە، دیسان هــەر لەبەرئەوەشــە کــە شیعرەکانی پیترارك تــا ئیمرۆکــەش زیندوون، هەر چەندە تەمەنیان خەریکە لە 600 ساڵ تێپەڕ دەکات.

پیترارك گیرۆدەی خۆشەویستی شوخێکی میردار بەناوی لۆرا (لاورا) وە بوو. لەتەمەنی بیستوو سێ ساڵیدا لۆرا لە کلێسەسەکی ئەفینیۆن لە تەلی دڵی پیترارکی دا، بەڵام تا دوا هەناسەی ژیانی ناونیشانی نەدا بەدەستەوە نەبا، خوانەکردە ناوی بزڕێ، یادی لە سینەی خۆیدا پاراست و نەمریی لە شیعرەکانیدا بۆ نووسی بێ ئەوەی رۆژێ لە رۆژان توخنی بکەوێت لەوەدا پیترارکی مرۆڤی وەك پیترارکی هونەرمەندو وەك شیعرەکانی بەرز بوو، پیترارك دەربارەی خۆشەویستی لۆرا نووسیویە و دەڵێت.

"سەعات یەکی رۆژی شەشی نیسانی ساڵی 1327 بۆ یەکەم جار لە کلێسەی سانتا کلارای شاری ئەفینیۆن چاوم بە لۆرا کەوت کە لە گۆرانێکانمدا دەنگی دایەوە. ساڵی 1348 یش هەر لەو شارە و هەر لەو مانگە و رۆژو سەعاتەدا ئەو خۆەر لە ژیانمدا ئاوابوو"[124]

پیترارك وستایانە ناوی لۆرای لە شیعرەکانیدا بەکاردەهێنا ، کەڵکی لەوە وەردەگرت کە لۆرا واتای ئەو گەڵا دەگمەنە دەبەخشێت کە رۆمانەکان کاتی خۆی تاجە گوڵینەی سەرکەوتنیان پێ دەچنیو پاشان دانیشتوانی ئیتالیا وەك نیشانەی قەدرو رێز یەکێکیان لێنایە سەر سەری خۆی. پیترارك ئەو مانا بەرزەی بۆ خۆشەویستێکی رەسەنی تری تەرخان کرد — نیشتمان!.

خۆشەویستی نیشتمان لای فرانچیسکۆ پیترارك بێ سنوور و بێ ئەندازە بوو ، ئەوەش دیارە، لە تێگەیشتنی بێ لادانی ئەرکەکانی قرناغەوە هاتبوو. هەر لەو قوژبنەشەوە سەیری مێژوویی سەردەمی رۆمانەکانی دەرکردو ئەو هەموو بایەخەی

---

[124] ول ديورانت، قصة الحضارة ، الجزء الاول من المجلد الخامس (18) ، ترجمة محمد بدران ، الطبعة الثانية، القاهرة ، 1967، ص 7.

بـه ڕابـردوو دەدا، دەیویسـت لەوڕێگەیـەوە بـەووردی لـە هۆیـەکانی هێـزو دەسـەڵاتی ئەوسـای نیشـتمان تێ بگـات، کـەم شـت وەك دابـەش بـوون و پارچـە پارچـەیی ئیتالیـا هەناوی دەهەژاند، پیترارك چاوی بەرایی نەدەهات ڕۆمای کاول و دواکەووتوو ببینێت گـوژراوی ئـەوە بـوو ڕۆمـا بگەڕێتـەوە دۆخەکـەی جـارانی، بگەڕێتـەوە ئـەو ڕۆژگـارەی لەسـەرتاپای جیهانـدا شـارێك نـەبوو شـان بـدات لەشـانی ، دەیویسـت ئـەو سـەردەمە بێنێتـەوە یـادی هاوچەرخانی کـە نیشـتمان تێیـدا نەسوخرەکێشی ئـەمو نـەگیرۆدەی دەستی نەویان بوو، لە پێناوی بووژاندنـەوەی ڕۆمـای خۆشەویستدا پیـترارك تەنانـەت پاپاکانی هان دەدا لە ئەڤینیۆنەوە بگەڕێنەوە ئیتالیا، بە ووشەی نازدارو هەڵبـژاردە لـە تەلی هەستی هەموانی دەدا:

"ئاخۆ کێ بێت گومانی هەبێت<br>
کەی ڕۆما هۆشی وەبەر خۆیدا هاتەوە،<br>
جەنگاوەرییەکەی جارانمان دەژێتەوە؟"[125]

***

"ئەی خوێنی لاتینی بەرێز هەڵچۆ[126]<br>
کۆت و زنجیری ئەستۆت بخەرە ژێر پێتەوە!" [127]

ئـا بـەو جـۆرە پـیترارك هاونیشـتمانییانی دەبزوانـد، بـەزرای پرشـنگداری وشـە، ڕێگـەی ڕاسـتی نیشـان دەدان. دیـارە دەبـوو دووربینێکـی وەك پـیترارك بـە هەسـت و بـەگیان و بـە قەڵـەم لەگـەڵ هـەموو دیـاردە و بزووتنـەوەو ڕووداوێکـدا بووایـە کـە ترووسـکەی هیـوای بـۆ گـەل و نیشـتمان لێ بـەدی بکرایـە. لەبـەر ئـەوە زۆر بەگـەرمی پشـتی ئـەو ڕاپەڕینـەی گـرت کـە بـەهاری سـاڵی 1347 چەوسـاوانی ڕۆمـا دژی دەرەبەگـەکاتی بـەرپایان کـردو ئـاڵای کۆماریـان بەسـەرکردایەتی کـۆلا دی ڕێنـزۆ " Cola di Rienzo" تیا هەڵکرد. پیترارك بـۆ خـۆی هاوڕێی کـولا دی ڕێنـزۆ بـوو، پێکەوە چەند ساڵێکیان لەساری ئەڤینیۆن بردە سەرو کاری زۆری کردە سەر ڕێبازی

---

[125] I.I.جوبیر ، فراچیسکۆ پیترارك ، " مێژووی جیهان" بەزمانی ڕووسی ، بەرگی سێیەم، مۆسکۆ/ 1957، ل 625.

[126] بەکەمێك دەستکارییەوە وەرم گێڕاوە

[127] R.S Hoyt , Europ in the Middle Ages, London, 1957, P594

ژیان و جۆری بیرکردنەوەی . لە "گیانی بەرز"دا کە یەکێکە لە شاکارە نەمرەکانی، پیترارك بە پەرۆشەوە کۆلا دی ڕێنزۆ ی هاوڕێی بۆ ڕزگارکردنی نیشتمان هان دەدا[128] .

بەهەمان دەستوور فرانچیسکۆ پیترارك رووی دەمی دەکردە هەمووان، بەشی زۆری سشیعرەکانی نامەن بۆ پاپا و میرو پاشاو نووسەرە مردووەکان، دەیویست لە چاکەو خراپەیان وێنەی ڕێگەی ڕاست بۆ نەوەی هاوچەرخ و دوا ڕۆژی ئیتالیا بکێشێت. هەر لەبەر ئەوەش بەشێکی تری شیعرەکانی نامەن بۆ نەوەی داهاتوو، بۆ ئەوانەی هێشتا لەدایك نەبوون، لەشاکاری :ئیتالیای نیشتمان" و "نامە بۆ نەوەی داهاتوو"[129] و "ئەفەریقا"[130] و بەرهەمی تریدا ، کە بەداخەوە بەشێکیان فەوتاون، لەوجۆرە نامانەی پیترارك بەدی دەکرێن.

پیترارکیش، هەرچەندە وەك دانتێ ئیمانداربوو، لە بەشێك لە نامەکانیدا زۆر بە توندی ڕەخنەی لە کلێسەو ڕەفتاری ناهەمواری سەردارانی گرتووە. لەبەر ئەوەی پیترارك لە کلێسە خوێندبووی ماوەیەك فەرمانبەری دەزگایەکی ئاینی بوو، بەشی زۆری ژیانی لە ئەفینیۆنی پایتەختی ئەوسای پاپاو کاردینالەکان بردبووە سەر، لەبەرئەوانە زۆرچاك ئاگاداری بەدڤەڕیی کاربەدەستانی کلێسە بوو. ئەشتەری ڕەخنەی نامەکانی هێند لێیان تیژ بوو، تا مردن زاتی نەکرد بەشێکیان بلاو بکاتەوە. "نامە بێ ناونیشانەکان" ناونیشانی ئەو شیعرانەی پیترارکە، کە کلێسە و پاپاو قەشەو ڕەبەنە بەرەڵلاکانی پێ ڕیسوا کردوون.

لەگەڵ ئەو هەموو بۆچوونە وردانەیدا پیترارکیش بە دەستووری دانتێ، نەیتوانی بەتەواوەتی خۆی لەکۆتی کۆن ڕزگار بکات. بۆیەکا ئەمیش وەك ئەو، کەوتە چەند هەڵەیەکەوە. ڕاستە پیترارك لە بەرهەمەکانیدا لە ژیانی سەرزەمین دوور نەکەوتەوە، یەکسەر دەدوا، بێ سڵ کردنەوە کەڵکی لە بەرهەمی شاعیرە بت

---

[128] دەوروبەری کۆتایی سالی 1354 ناحەزانی کۆلا دی ڕێنوۆ زەفەریان پێی بردو کوشتیان.

[129] کورتەی ژیاننامەی خۆیەتی

[130] دەربارەی سەرکەوتنی ئەسکیپۆی ئەفریقاییە بەسەر هانیبال ناودارا، ئەو سەرکەوتنەی کاتی خۆی ڕزگاری بۆ ئیتالیا هێنا.

پەرستەکانی وەك ڤێرجیل وەردەگرت[131] . بەلاّم لە هەڵبژاردنی ئامرازی گۆڕینـدا چـان نیشانی نەپێکا.

لەبەر ئەوەی ئەو هێزانەی ئەو پەنای بۆ دەبردن لە ژیانی خۆیدا هیچیان بۆ هەڵنەسوڕا، ئەویش پەلەی بوو، باش لە تەمەنی درێژی مێژوو هێزە بزوێنەرەکانی تێ نەدەگەیشت. لەبەر ئەوە بێ هوودە لەدوا ساڵانی تەمەنیدا رووی کردە ئیمپراتۆریی پیرۆزی رۆمانی[132] . دەیویست بەزۆر گیانی بکاتەوە بە بەرداو لەو رێگەیەوە بنیاتی رزگاری نیشتمانو ئازادیی گەل بنێت، بەر لەکۆچی دواییشی لە ژمارەیەك لە بیرەوەرییەکانی زۆی دەربارەی ژیان پاشگەز بۆوەو بەرهەمێکی بەناوی "تەحقیری ژیان"ەوە[133] بڵاو کردەوە. هەر بەو هۆیەشەوە پیترارك دوا رۆژەکانی ژیانی بە گۆشەگیری بردە سەر. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا تا رۆژی نۆزدەی تەمووزی ساڵی 1347 لە ئارکوای نزیك پادواوە چاوی لێك نا، نیشتمان و گەلی لە یاد نەکرد.

فرانچیسکو پیترارك ، بێگومان شایانی ئەوەبوو یەکسەرجێگەی رەوا لە قووڵایی دڵسوزاندا بۆ خۆی بکاتەوە، نازناوی میری شاعیران و ڤێرجیلی نوێی پێ رەوا بوو. لە رۆژانی ژیانی خۆیەوە بەدەیان ئەدیبی ئیتالی لەدەوری بەرهەمە نازدارەکانی کۆوونەوەو نوێکاریی لێوە فێردەبوون، لە نووسین و خوێندنەوەدا لاساییان دەکردەوە، بەرادەیك "پێترارکیزم" بووە زاراوێکی باوی ناو کۆڕە ئەدەبییەکانی ئەوسای ئیتالیا، بۆکاشێوی ناودار یەکێك لە شاگردو هاورێ نزیکەکانی پیترارك بوو کەتەنانەت بەشێوەش تا رادەیك وێك دەچوون[134] .

---

[131] دەربارەی ڤێرجیل بڕوانە بەشی یەکەمی ئەم وتارە.

[132] مەبەست لە ئیمپراتۆریەتی پیرۆزی رۆمانی (الامبراطورية الرومانية المقدسة) ئەو دەوڵەتە فراوانەی سەدە ناوەنجییەکانەی کە ئەڵمانیا بەشێك لە ئیتالیاو خاکی چیك و سویسرە و هوڵەندە و بەلجیکا و لۆکسەمبۆرگ و چەند هەرێمێکی تری ناوەندی ئەورووپای پێکەوە بەستبوو "ساڵی 962 ئۆتۆی یەکەمی پاشای ئەڵمان دای مەزراند". پاش چەند سەدەیەکی کەم ئیمپراتۆریەتی پیرۆزی رۆمانی بووە دەزگایەکی بێ دەسەلات ، هەرچەندە بەناو تاوەکو 1806 مایەوە. لەسەردەمی رێنیسانس دا رۆژی ئیمپراتۆریەتی پیرۆزی رۆمانی تەواو بووبوو.

[133] De Contemptu Mundi

[134] R.Weiss,op, Chfi, P.29

جیۆڤانی بۆکاشیۆ و هەزارو
یەك شەوەی ئەوروپا:
هەزاری لەسامان بێ بەریمان
دەکات، بەڵام ناتوانێت
دەست بۆ ئابڕوومان ببات!

## - بۆكاشیۆ -

شارەزایان بۆکاشیۆ بە سێیەمین پێشەنگی کاروانی رووناکبیرانی رۆژگاری رێنیسانس دادەنێن، لەبەرئەوە شوێنی ئەویش لە تۆماری نەمرانی مێژوودا دیارو پرشنگدارە.

سالّی 1313 جیۆڤانی بۆکاشۆ "J.Boccaccio" لە پاریس لە باوکێکی بازرگانی ناسراوی فلۆرەنسەیی و دایکێکی نەناسراوی فەرەنسەیی لەدایك بوو[135] هەر بەمندالّی باوکی هێنایەوە ئیتالیا و چەند ساڵێکی ناخۆشی لەگەڵ باوەژنی لە شارێکی نزیك فلۆرەنسەدا بردەسەر، لەتەمەنی دە ساڵیدا باوکی ناردییە شاری ناپۆلی بەو نیازەی وەك خۆی رێگەی بازرگانی بگرێتە بەر، بەڵام بۆکاشێو لەوساوە ئارەزووی خوێندنەوە و دانانی شیعر دای لەی کەللەی، شیعری بە خۆراکی هەزار دادەنان. بۆکاشیۆ تەنانەت مەیلی نەدایە خوێندنی یاساو ئاینیش کە حەزی دووەمی باوکی بوون. لە هەرەتی لاوییەوە بۆکاشیۆ تێکەڵ بە دەستەی رووناکبیری ناپۆلی بوو کە ئەویش ئەوسا، وەك فلۆرەنسە یەکێك بوو لە شارە پێشکەوتووەکانی ئیتالیا، وا دیارە سەرەتای خوێندنەوەی قووڵی بۆکاشیۆ بە بەرهەمی دانتێو پیترارك دەستی پێ کردووە.

هەرزوو، لە تەمەنی هەژدە ساڵییەوە جیۆڤانی بۆکاشیۆ تووشی داوی خۆشەویستی بوو ، ئەویش وەك پیترارك لە کڵێسەیەکی شاربە تیری عەشقی ماریای زۆڵە کچی پاشای ناپۆلی گرفتار بوو[136] ماریا لە ژیان و هونەری بۆکاشیۆدا دەوری

---

[135] تاوەکو ئیستە رۆژی لەدایك بوونی نەزانراوە.

[136] دایکی ماریا یەکێك بوو لە دۆستەکانی پاشای ناپۆلی.

پاتریسی دانتیّ‌و لۆرای پترارکی بینیی‌و ناوی لای ئەو بووە فیامێتا "Fiammenta" واتە ئاگرۆك یا پشکۆ [137]. هەموو رۆمانە زووەکانی بۆکاشیۆ بۆ باسی خۆشەویستیی فیامێتا تەرخان کراون. وەك رۆمانی فیلۆکۆلۆ کە ساڵی 1338 دەستی پێ کردو دوایی تەواوی کرد. لەو بەرهەمانەیدا کە بەزمانی نەتەوەیی و زاراوی تۆسکانی دایڕشتوون، بوکاشیۆ کۆن ونوێی تێکەڵ کردووەی و گەلێك سامانی رۆشنبیری رۆژگاری خۆی‌و بەر لە خۆی پاراستووەو چرای بۆ پەخشانی نوێ هەڵکردووە. ئەمەی دواییان بۆ ئەو سەردەمەی هەمووان، بەشوان و گاوانەوە، تیا بووبوونە شاعیر و بایەخی بۆ پێشخستنی رەوڕەوەی ئەدەب یەکجار زۆر بوو. ساڵی 1340 واتە لەتەمەنی 27 ساڵیدا جیۆڤانی بۆکاشیۆ گەڕایەوە شاری فلۆرەنسە لە کاتێکدا هێزە پێشکەوتووەکانی دەسەڵاتیان گرتبووە دەست، دانیشتوانی شار زۆر بەگەرمی پێشوازیان کردو وەك نیشانەی خۆشەویستی و رێزو تاجە گوڵینەی سەرکەوتنیان نایە سەری، فەرمانڕەوایانی فلۆرەنسەش دەرگەی کاری گەورەیان بۆخستە سەر پشت، بەو جۆرە ژیانیکی لەبارتر بۆ بوکاشیۆ گونجاو دەریای بیری لە جاران زیاترخرۆشا، لە فلۆرەنسە رۆمانی فیلۆکۆلۆی تەواو کردو ژمارەیەك رۆمانی تری دانا کە یەکێکیانی ناو نا "فیامیتا" و ساڵی 1345 لە نووسینی بۆوە، پاش پێنج ساڵ، واتە دەوروبەری ساڵی 1350 دەستی کردە دانانی شاکاری "دیکامیرۆن" کە سێ ساڵی رەبەقی پێوە خەریك بوو. "دیکامیرۆن" بۆکاشیۆی گەیاندە لوتکە.

ئەوساڵانەی بۆکاشیۆ بەدانانی "دیکامیرۆن" ەوە خەریك بوو رشانەوە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپای گرتبۆوە [138]. فلۆرەنسە یەکێك بوو لەوشارانەی رشانەوەی ساڵی 1348 قڕی خشتە ناو دانیشتوانیانەوە [139]. سەرچاوەکانی ئەو سەردەمە دەڵێن

---

[137] لە ئاگرەوە، فیامێتا بچووککردنەوەی نازداریی کڵپەی ئاگرە.

[138] ساڵی 1333 نەخۆشی رشانەوە سەرتاپای چینی گرتەوە و لەرێگەی چینەوە چەند ناوچەیەکی تری ئاسیا خراپ تووش هاتن، بەهۆی کێچ و مشکی ناو ئەو کەشتییانەی کەل وپەلی بازرگانیی رۆژهەڵاتیان دەهێنایە ئەوروپا، ئیتالیا و ژمارەیەك وڵاتی تری ئەو کیشوەرەش دەروبەری ساڵی 1348 هەمان نەخۆشییان تیا بڵاوبۆوە.

[139] بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە:

ول. دیورانت ، قصة الحضارة، الجزء الاول من المجلد الخامس ، 1967 ، ص 52-55

لەماوەی تەنها شەش مانگی یەکەمدا سێ دەر پێنچی خەڵکی فلۆرەنسە بەو دەردە مردن، بۆکاتشیۆ ژمارەی ئەو مردوانەی بە 96 هەزار کەس داناوە، کەوا پێ دەچێ فیامێتاش یەکێکیان بوو بێت، خانووبەرە و شەقامەکانی شار بە لاشەی مردوو داپۆشرا بوون، باوکێك نووسیوییەە چۆن بەدەستی خۆی پێنج لە منداڵەکانی لە چاڵێکدا ناشتووە. لەو رۆژە ستەمانەدا بۆکاشیو دەستی کردە دانانی "دیکامیرۆن" .گوایە حەوت کچ و سێ کوڕی فلۆرەنسەیی ئەو رۆژانە لە یەکێك لە کڵێسەکانی شار یەکتر دەبینن و بڕیار دەدەن بۆ ماوەی دە رۆژ پێکەوە بچنە فیللایەکی قەراغ شار تا بەو جۆرە خەمی خۆیان برەوێنن[140] لەوێ بۆ هەر شەوەی پاشایەك بۆ کۆڕەکەیان هەڵدەبژێرن، هەر شەوەش دەبوو هەر یەکەیان چیرۆکێك بگێڕێتەوە کە پاشا لەسەرەتاوە باسەکانی ی دیاردەکردن. هەر لەوەشەوە بۆکاشیو ناوی "دیکامیرۆن" ی بۆ چیرۆکەکانی هەڵبژارد کە لە دوو وشەی یۆنانی کۆن پێکهاتووەو پێکەوە مانای "یاداشتی دە رۆژ" دەگەیەنن[141] . زۆر نووسەر "دیکامیرۆن" یان ناوناوە "هەزارو یەك شەوەی ئەوروپا". وایێ دەچێت بۆکاشیۆ کاتی خۆی چیرۆکەکانی "هەزارو یەك شەوە" ی خوێندبێتەوە کە لە رۆژگاری شەڕی خاچدارانەوە کرابوونە لاتینی. بە پێی قسەی جاستون باری لەو کتێبەدا کە ناوی ناوە "ئەدەبی فەرنسەیی سەدە ناونجییەکان" لە ڕێگەی بۆکاشیۆوە ژمارەیەك لە چیرۆکە رۆژهەڵاتییە باوەکان گەیشتوونە دەست ئەوروپاییەکان[142] .

چیرۆکەکان "دیکامیرۆن" کورتن، تێکڕا یەکی شەش حەوت لاپەرەدەبن، هەریەکیان پێشکییەکی کورتی لەگەڵدایەو هەموویان بەزمانێکی یەکجار پاراوو ناسك و بەهێز لەسەر بنچینەی دیالێکتی تۆسکانی دارێژراون و تاوەکو ئیمرۆکەی ئێمەش سەرنجی خوێنەران رادەکێشن . بەلای شارەزایانەوە "دیکامیرۆن" دەوری لە دارشتنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ئیتالیا تەنانەت لە "کۆمیدیای یەزدانی" ی دانتێو

---

E.Peters,Europe, The World of the Middle ages, Newjersey, 1977 pp527-528

[140] بۆکاشیۆ ناوی فامیتای خۆشەویستی بۆ یەکێك لەو کچانە هەڵبژاردووە.

[141] Deka hermal

[142] بڕوانە محمد مفید الشوباشي، رحلة الادب العربي إلى أوروبا ، القاهرة ، ص 126-127.

بەرهەمەکانی پیترارکیش زیاتر بووە، ئەوانە بەسەر یەکەوە بەلگەی یەکەمن کە جیۆڤانی بۆکاشیۆ لە گێژاوی سەدەی چواردەمیندا ورەی بەرنەداو چاك لە ئەرکەکانی قۆناغ تێ گەیشت و بەو جۆرە رێگەی راستی خزمەتی گەل و نیشتمانی گرتەبەرو چووە خانەی بەرزی نەمرانەوە. فلکلۆرو حیمایەتی باوی ناو خەلکی سادەو ساکاری ئیتالیاو فەرەنسەو داستان و ئەفسانەی رۆمان و یۆنانیەکان و چیرۆکە باوە رۆژهەلاتییەکان سەرچاوەی "دیکامێرۆن"ن. بۆکاشیۆ زۆر هونەرمەندانە ئەو کەرەستە رەسەنەی تێکەل بە باری ژیانی ئەوسای ئیتالیا کردووەو وەستایانە هەولی داوە تیماری بیمارییەکانی کۆمەلی پێ بکات، قارەمانەکانی "دیکامیرۆن" نموونەی هەموو دەستەو چینەکانی کۆمەلن- لە پاشاو میرەوە تاوەکو بازرگان و قەشەو رەبەن و ئینجا خەلکی سادەو ساکار، لە کورتبینەوە تاوەکو دووربین، لە تەپۆوە و نەفامەوە تاوەکو زاناو دانا.

چیرۆکەکانی "دیکامیرۆن" زۆر بەرز خۆشەویستیی وەك دیاردەیەکی رەوای ژیان دەنرخێنن، ئەوەی بەهیچ جۆر لەگەل سەرنجی ئەوسای کلێسەو ژیانی رەبەنیدا نەدەگونجا. لەو قوژبنەوە جیۆڤانی بۆکاشیۆ وێنەیەکی دلڕفێنی ژیانمان بۆ دەکێشێت، بێ بەزەیی فەلەقەو دارکاریی ئەو کەسانە دەکات کە مانای بەرزی خۆشەویستیی دەشێوێنن.

هەمان کات خاوەنی "دیکامیرۆن" سەرکەووتوانە بەشێوازێکی نوێ هەولی داوە لە رێگەی پلارو توانجی بەجێ و نموونەی پڕ ماناوە دوو پەلە هەوری رەشی ئاسمانی رۆژگاری خۆی برەوێنێتەوە کە بووبوونە هۆی کوێرکردنەوەی گەلێك راستیو هێزی بزوێنی ژیان. یەکەمیان پێوەندی بەنرخاندنی مرۆڤ و دووەمیان پێوەندی بەکۆتەکانی کلێسەوە بوو.

لە "دیکامیرۆن" دا کەم لایەنی تری ژیان بەرادەی نرخی مرۆڤ سەرنجی بۆکاشیۆیان راکێشاوە. لەزۆربەی چیرۆکەکانیدا دەیەوێت تێمان بگەیێنێت کە نرخی مرۆڤ والە خۆیدا نەوەك لە وەجاغ و بنەچەو خێل و خێزانیدا، بۆ پێکانی ئەو نیشانە بەرزە جیۆڤانی بۆکاشیو وەك هونەرمەندێکی بەدەسەلات لەگەل خۆیدا دەتباتە ناو ناخی دەروونی قارەمانەکانییەوە، هەموویانت بۆ رووت و قووت دەکاتەوە. وات لێ دەکات پڕ بەدل بەمیرێکی گێل یا بە بازرگانێکی چاوبرسی پێ بکەنێت و بەو

رادەیـــەو، بگـــرە زیـــاتریش، ڕێـــزی کـــورە شـــوانێکی زیـــرەك بگریـــت، زۆرجـــار دوای پەتپەتێنێکی باش سەر بە پاشاو میرو وەجاغزادەکان شۆڕ دەکات, کەلکەڵەی سەفەری هات و نەهات دەخاتە کەللەیانەوەو بەدەستی بەتاڵ دەیانگێڕێتەوە ناو کۆشك و تەلارە رازاوەکانیان.بەئاسانی دەیانکاتە مەخسەرەی یەکێك لە نۆکەرە زیرەك و وریاکانیان.

هەموو جارێکیش تەنها راستیو دڵسۆزی سەردەخات ئەگەر چی لە رێگەی بە قوربانی کردنی جووتێك شۆخیشەوە بێت. ئەوەتا جێسمۆندی کچی تانکریدی پاشای سالیرنۆ دەکەوێتە دوای خۆشەویستی جیسکاردۆوە کە یەکێك بووە لە یاساوڵە وەجاغزادەکانی باوکی، جێمسمۆندی شا کچ بەدەیان میر و ئاغا و بەگی قۆزو دەسەلاتداری دەبینی کە هەموو لە خوایان دەویست پێیان قایل بێت، بەلام کەس وەك جیسکاردۆ تەلی دڵی نەهەژاند، چونکە نەك هەرلاوێکی شۆخ بەڵکە زیرەك و وریاو خاوێن و دڵپاك و دڵسۆزیش بووە کە پاشای باوکی لە رقانا جیسکاردۆی نەدارو نەناسراوی کوشت و لە جامێکی زێڕدا دڵی بۆی نارد، جیسمۆند دوای ئەوەی هەر لەو جامەدا ئەو ژەهرەی ئامادەی کردبوو خواردییەوە و بەر لەوەی چاوە گەشەکانی لێك بنێت رووی دەمی کردە پاشای باوکیو پێی گوت:

> باوکی بەڕێزم ! ئێمە هەمووەکان بەرهەمی یەك دەست و یەك کەرەستەین.. چاکەو رەوست جیاتکەرەوەی یەکەمی مرۆڤن یاسا یا ئەوەی لە یاد کردبێت، بەلام سروشت هەرگیز لەیادی ناکاتن.. باوکی بەڕێزم گەر بەسەنگی رەوشت و چاکە ئەوانەی دەوروبەرت بکێشیت دەبینیت کەسیان ناگاتە قولە پێی جیسکاردۆ.ز هەژاری ، باوکی بەڕێزم ، لەسامان و پارەو پوول بێ بەریمان دەکات، بەلام ناتوانێت دەست بۆ ئابرومان ببات!

بۆ ئەوساکەی ئەوروپا کە سەنگی تەرازووی کێشانی مرۆڤ تێیدا وەجاغ و بنەچە بوو، کە هەر رۆژەی ئەونەمامێك لە قوژبنێکدا دەبووە پووشووی ئاگری یەکێك لە دەسەلاتداران، کە گەورەترین زاناو ئەدیبی "بێ ئەسڵ و فەسڵ" مافی نەبوو بیر لە کچە تەپۆیەکی میرزادە بکاتەوە، یا دەست بۆ هەندە وکارو فەرمانێك بەرێت کە تەنها لایەقی خۆی بوون، بۆچوونە وردەکانی جیۆڤانی بۆکاشیۆ دەسکەوتی گەورە و تێگەیشتنی دروستی ئەرکەکانی قۆناغ بوون، مەرجێکی بنەرەتی پێویست

بوون بۆ ئازاد کردنی مرۆڤ له تەوقە دەسکردە ناهەموارەکانی کۆمەڵ، دیارە بێ ئەوانیش بەرەوپێش بردنی گەل و رزگارکردنی نیشتمان لە کێشە کوشندەکانی کارێکی مەحاڵ بوو.

هەر بەو جۆرو شێوازەش بۆکاشیۆ کلێسەو پیاوە چاوچنۆکەکانی لە "دیکامیرۆن" دا ریسوا کردووە، بەشێ: لە چیرۆکەکانی ئەو شاکارە قەشەو رەبەنەکانی بۆ هەڵواسین و ئابڕووی رەفتار ناشیرینەکانی ی بۆ بردووین و بیری دواکەووتوویی بۆ خستووینەتە سەر ساجی عەلی، خوێنەر پڕ بەدڵ پێیان پێ دەکەنێت و هەست دەکات چۆن رۆژی ئەو فێڵبازانە لەسەر دەستی بۆکاشیۆ و مامۆستا و هاوەڵ و شاگردەکانیدا دەستی کردۆتە ئاوابوون، لەو چیرۆکانەی "دیکامیرۆن" دا بۆکاشیۆ پێمان دەڵێت لە خۆیان ئەوانەی دەیانەوێت رێگەی راست نیشانی خەڵك بدەن دەبێت بەر لە هەمووان بیر لە خۆیان بکەنەوە تاوەکو ببنە نموونە و قسەیان بە فیڕۆ نەڕوات، پێی وایە و راستیش دەکات، کە نابێت کەس قسەی ئەو مێزەر بەسەرانە بە پوولێك بکڕێت کەبۆخۆیان دەقاودەق و دیوی ئاوەژووی فەرمایشتەکانیان. بەشی ئەو جۆرە کەسانە لەکۆتایی چیرۆکەکانی "دیکامیرۆن" دا هەر ژێر کەوتنە چونکە لەژیاندا دەبێت هەر چاکەو سەرکووتووبێت، خۆ ئەگەر بەهۆی زەبری زۆردارانەوە بۆماوەیك وا رێك نەکەوت ئەوا چاکەکە دەبێـە نموونە و بەنەمری دەمێنێتەوە.

"دیکامیرۆن"یش وەك "کۆمیدای یەزدانی" یەکێکە لە شاکارە نەمرەکانی ئەدەبی جیهانی ، بەڵکو تا ئیمڕۆکەش ژمارەی خوێنەر ئەویان گەلێك لە هیی ئەمیان زیاترە[143] . "دیکامیرۆن" یەکەم جار ساڵی 1471 بەزمانی ئیتالیای چاپ کرا، بەڵام تا ئێستا سەدان جار بە ئیتالیای و بەهەموو زمانە پێشکەووتووەکانی جیهان چاپ کراوەتەوە. بەدەگمەن لە ئەوروپا کتێبخانەیەکی تایبەتی هەڵدەکەوێت دانەیەك لە "دیکامیرۆن" ی تێیدا نەبێت. دەبوو بۆکاشیۆش وەك دانتێی رەهبەرو پیترارکی مامۆستاو هاوڕێی دروست بۆ هەموو مەبەستەکانی نەچێت ، ئەویش وەك ئەوان، کوڕی رۆژگاری خۆی بوو، نەیدەتوانی خۆ لە هەموو داوەکانی کۆمەڵ رزگاربکات و

---

[143] دیارە ئەوە لە پایەی بەرزی "کۆمیدیای یەزدانی" کەم ناکاتەوە ، تەنها ئەوەندە هەیە تێگەیشتنی ناوەڕۆکی ئەو، زۆر لە "دیکامیرۆن" زەحمەتترە

بەوردی لە قووڵایی گشت هێزە بزوێنە نەبینراوەکانی تێ بگات، لەبەرئەوە هیچ سەیر نییە خەریك بوو بڕوای بۆکاشیۆ بەژیان کەمێك بلەقێنێت، بەر لە کۆچی دوایی بەماوەیەك پیترارك نەبوایە لەوانە بوو دەست لە نووسینیش هەڵبگرێت.

جیۆڤانی بۆکاشیۆ دواساڵەکانی تەمەنی بۆ کاری زانستی و نووسینی بەرهەمی مێژوویی تەرخان کرد. هەر لەو ساڵانەشدا بوو کەدەستی دایە توێژینەوەی بەرهەمەکانی دانتێو تاکۆچی دوایی کرد فریا کەوت حەڤدە لە سروودەکانی "کۆمیدیای یەزدانی" لێك بداتەوە یەکەم کتێب دەربارەی ژین نامەی خاوەنیان دابنێت.

ڕۆژی 21 ی کانوونی یەکەمی ساڵی 1375 جیوڤانی بۆکاشیۆ لە چێرتالدۆی نزیك فلۆرەنسە چاوی لێك ناو بووە نموونەیکی بەرزی تری ئەو ئەدیبانەی چاك لە ئەرکەکانی قۆناغ تێ دەگەن و دڵسۆزانە خزمەتی گەل و نیشتمان دەکەن، ئەوانەی هەمیشە ناویان بەزیندوویی دەمێنێتەوە.

## ئێرازمۆسی ڕۆتەردامی و "ستایشی کەران"

لەسەرتاپای ئەورووپای ڕۆژگاری ڕێنیسانس دا کەم زانای ئەوتۆ هەڵکەووتووە بتوانێ شان بە شانی ئێرازومۆسی ڕۆتەردامی "Erasmus Rotardamus" بدات یا بەرادەی ئەو کار بکاتە سەر ژیانی ڕووناکبیریی ئەوسای زۆربەی وڵاتانی ئەورووپا.

تاوەکو ئێستە بە تەواوەتی ڕۆژو ساڵی لەدایکبوونی ئێرازمۆس ساغ نەبۆتەوە . بە پێی هەندێك لێکدانەوە دەبێ ڕۆژی 28ی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی 1466 لەشاری "ڕۆتەردام"ی هۆڵەندا چاوی هەڵهێنابێ. سەرچاوەش هەیە 1469 بە ساڵی لەدایکبوونی دادەنێ.

ئێرازمۆس لەبەر ئەوەی بەهەتیووی گەورە بوو[144] لە زوویەکەوە ناچار بوو پەنا بەرێتە بەر یەکێك لە ڕەبەنگەکانی کڵێسە[145]، لەوێ بناغەی خوێندن و

---

[144] ساڵی 1484 باوکی کۆچی دوایی کرد بێ ئەوەی شتێکی ئەوتۆ بۆ خۆی و براکەی بەجێ بهێڵێ.

فێربــوونی بۆخــۆی دارشــت، هەرچــەندە بــەدڵ حــەزی لــە خوێنــدنی فێرگەیــەکی سەربەخۆ دەکرد. لەو سەردەمەی ژیانیدا کەمێك مەیلی وێنەکێشیی هەبوو، دوای ئەوەیش بەماوەیەك لای مامۆستایەکی ناسراو شتێك مۆسیقا فێر بوو، هەر لەوساشەوە شەقڵی زیرەکیو ووریایی و ئارەزووی بێ ئەندازەی خوێندنەوەی پێوەی دیاری دا.

زوو خولیای خوێندنی بەرزو گەڕان و هاتوچۆ دای لە کەللەی ئیرازمۆس. ساڵی 1495 هۆڵەندەی نیشتمانی بەجێ هێشتوو رووی کردە پاریسی فرەنسە. لەوێش بە چوار ساڵ بەشی تیۆلۆجی[146] زانکۆی پاریسی بڕیو زۆری نەبرد بووە رابەری "کۆلیج دی فرانس"ی بەناوبانگ. دوای ئەمەوە کەوتە گەڕان بە وولاتانی ناوەندو رۆژئاوای ئەوروپادا، نیشتمانی خۆی دەپەرست، بەڵام وولاتانی تریشی زۆرخۆش دەویست. کە کاربەدەستانی "زوێریخ" تکایان لێکرد شارەکەیان گەورە بکات و لەوێ بە یەکجاری نیشتەجێ ببێ. بەدەم سوپاسێکی گەرم و گوڕەوە تێی گەیاندن ئارەزووی لەوەیە ببێتە هاونیشتمانی هەمووان و باوەش بەسەرانسەری جیهاندا بکات.

لەبەر ئەوە "ئیرازمۆسی رۆتەردامی" تاوەکو گوڕی پێ ما بە دەگمەن تا سەر لەیەك وڵات و یەك شارو لە یەك شوێن دەژیا، دوای هوڵەندە و فەرەنسە شەشە ساڵی رەبەقی لە "کەمبریج ئوکسفۆرد"ی بەناوبانگی ئیتالیا بردەسەر، چەند ساڵێکیش لە ئەڵمانیاو ئیتالیا ژیاو لە ساڵی 1513 ەوە سویسرەی کردە مەڵبەندی خۆی. دوای ئەوەی پیری رووی تێکردو گوڕی لێ بڕی ناچار دوا پازدە ساڵی ژیانی بە تەواوەتی لەشاری "بازل"ی سویسرە[147] نیشتەجێ بوو، ئیتر زۆر بەدەگمەن ئەوشارەی بەجێ دەهێشت تا رۆژی دوازدەی مانگی تەمووزی ساڵی 1536 لەوێ گیانی سپارد.

لە ئەفامان و حەسوودان بەولاوە یەکێك نەبوو ئیرازمۆسی رۆتەردامی بەدڵ خۆش نەوێت. زاناو رووناکبیرە کەڵەکانی سەرانسەری ئەورووپای رۆژگاری خۆی

---

[145] ئەگەر رەبەن (راهب) و (راهبە) بێ ئەوا دەتوانین رەبەنگە لەسەر کێشی پرسگەو پەناگە بۆ (دیر) و (أديرة) بەکار بهێنین.

[146] Theology واتە (لاهوت)) یان زانستی ئایین.

[147] (بال) یش دەگوترێ.

شانازییان بـه هاوڕییـەتی یـا شاگردێتی ئیرازمۆسـەوە دەکـرد. بۆخۆیشی ڕووخـۆش و دڵسـۆزو دڵ فـراوان و دەسـت کـراوەو قسـە لـەڕوو، دوژمنـی باوەکوشـتەی درۆزن و قسـەبەرو زمـان درێـژو خۆهـەڵکێش و نـەزان، ڕازێنـەوەی کـۆڕو گـوڵی سەردەستەی مەجلیسان و دەم ڕاستی هەمووان بوو، بەکورتی زانایەکی پیاوو پیاوێکی زانا بوو.

بە شایەتی هەمووان خامە ڕەنگینی وەك یرازمۆس لە ژیاندا کەم هەڵکەووتووە. نووسـینەکانی تیـغ بـڕو نیشـان شـکێنو هەسـت بـزوێن و ناسـك و ڕازاوەن. بـەرەوانی یاریی بە ووشەو ڕستەو، نوێکاریی لە نووسیندا دەکرد. گەلێك زمانی دەزانی و زمـانی لاتینیشی وەك زمان زگمـاك دەزانـی وخـۆی فێـری گـریکیش کـرد، ئـەو ووردەکارییـەی ئیرازمۆس لە فۆنەتیکی زمانی گریکیدا کردی بۆی بـووە شێوازو لـە مەیـدانی زانسـتدا خۆی چەساند.

ئێرازمۆسـی ڕۆتـەردامی لـە نووسـنەکانیدا جگـە لـەناوی خـۆیو دوو نازنـاوی ئەدەبیشـی بـەکار دەهێنـا, یەکـەمیان دیزیـدێریۆس "Desiderius" و دووەمیـان جێرهارد جیرهاردز

" لەهەندێك زماندا گێرهارد گێرهاردز "Gerhard Gerhards" بوو.

بێگومـان زانایـەکی وا دانـا دەبـوو دروسـت و ورد لـە ئەرکەکانی فۆنـاغ تێبگـات. لەوەیش زیاتر، زانای ئەوتۆ هەن دەڵێن جیهانی پـڕ کێشـەو ئەندێشـەی ئیمرۆکـەشمان بەرادەی ئەوسای ئەوروپای پێویستی بە پەندە وردەکانی ئیرازمۆسە[148]

بیروڕای مرۆپەروەرانـەی[149] بـاوی ڕۆژگـاری ڕێنیسـانس لەچـەند بەرهـەمێکی ئێـرازمۆسـی ڕۆتـەردامیـدا بـەڕوونی خـۆی نوانـدووە, وەك کتێبـی "ڕابـەری جـەنگی عیسایی "[150] کەساڵی 1501 تەواوی کردو کتێبی "دژی بەربەران "[151] کە دوای ئـەو بەنزیکـەی 20سـاڵ لـە دانانی بـۆوەو زۆر بـەرز ئـەدەبی کلاسـیکی تێـدا نرخانـد. لـەو

---

[148] وەك زانای سویسرایی فرنەری کایجی و زانای هۆڵەنـدیی یۆهان هۆیزبخا بڕوانـە" أعـلام و أفكار نظرات في التأريخ الثقافي" ، تأليف المؤرخ الهولندي الكبير يوهان هويزبخا، ترجمـة عبـدالعزيز توفيـق جاويد ، مراجعة الدكتور زكي نجيب محمود، القاهرة1972 ، ص 366، 383-384

[149] Humanism.

[150] (Enchiridion Militis Chritian)

[151] (Antibarbarorum Liber)

نوسینانەیدا ئێرازمۆس هەوڵی داوە نیشانی بدات نهێنیەکانی ئاینی عیسایی لەسەروو رادەو توانای تێگەیشتنی مرۆوەن. هەمان کات ئەو قوژبنی ئاڵ و گۆرو بەرەو پێش چوونی مرۆڤ و دەسکەوتەکانییەوە سەیری ئاینی عیسایی دەکرد.

ئیرازمۆس باوەڕی بە ئاڵوگۆرو بەرەو پێش چوون زۆر هەبوو، لەو قوژبنەوە سەیری دیاردە گرنگەکانی ڕۆژگاری خۆی دەکردوو دەیگوت" زانست دەژێتەوەو جیهان دەگەڕێتەوە سەر ڕێگەی ڕاستی هۆش و ئەدەبی بالآش دیسان دەگەشێتەوە ". بەلآم شان بەشانی ئەوەش ئێرازمۆس پێی وابوو خووڕەوشتی مرۆڤ و ئارەزووی پتر لە سروشت هێزی بزوێنی ژیان و ڕەوڕەوەی مێژوون. لەگەڵ ئەوەشدا ئێرازمۆس شوێن و جێگەی تایبەتیی سروشتی بە تەواوەتی لەیادنەکردووەو جاروبار لە نووسینەکانیدا بە پیاهەڵدانێکی زۆرەوە باسی دەکات، ژیان و هونەرو زانست لە بەروبوومی دوورناخەتەوە.

سەرنجەکانی ئێرازمۆس دەربارەی دەسەلآتی میرو دام و دەزگای میریی لەو بەرهەمەیدا رەنگیان داوەتەوە کە ساڵی 1516 بەناوی "پەروەردە(یا فێرکردنی) میری عیسایی"ەوە بلآویکردەوە[152] . ماکی ئەو سەرنجانەی لە دەوری ئەو بیرەی دەسوڕێتەوە کەلە قوژبنی ئەوەوە دەیڕوانییە بڕبڕەی دامەزراندنی دامو دەزگای میری یاسای ژیان و بەرژەوەندییەکانی کە پێی وابوو پلەیان گەلێك لە ژوورووی تاك و تایبەتییەوەیە. هەرچەندە ئەم لێکدانەوەیە بۆ ڕۆژگاری خۆی بۆچوونێکی ووردبوو، بەلآم ئێرازمۆس، وەك دوایش باسی دەکەین، نەیتوانی بە قووڵی لەدیاردە سیاسییەکانی ژیان و هێزە نەبینراوە بزوێنەرەکان تێبگات.

بیوڕاکانی ئێرازمۆس دەربارەی ژیانی سیاسی هەرچەندە تاڕادەیەك سادەو ساکارن، بەلآم بۆ ئەوسای ئەورووپا کەمبایەخ نەبوون. ئەو، بۆ خۆی پیاوێکی هێدیو هێمن، لەسەرخۆو یەکجارنەرم و نیان بوو، بە سروشت سەر بە ئاشتی و دژ بە شەڕبوو. هەر لەبەرئەوەش لەگەڵ هیچ ئاڵ و گۆڕێکدا نەبوو کەهێزی تێدا بەکاربهێنرێ. پێی وابوو هۆشی وردو خوێندەواریی بەرزو زانینی زۆر ؛ بۆیان هەیە مرۆ لەکێشەو چەرمە سەرىو، دەوڵەتان لەبێنەو بەرە رزگار بکات. دەیگوت ئەقڵی مرۆ، کەچڵەپۆپەی بەرزییە دەتوانێ ببێتە بناغە بۆ هەر رژێمێکی سەرکەوتوو،

---

[152] (Institutio Principis Christiani)

بۆیـەکا سـووربووە لەسـەر ئـەوە کـەدەبێ مـیر هەمیشـە پـەنای بـۆ بـەرێ تـاوەکو لەرێگەیەوە بتوانێ تۆوی شەڕو دووبەرەکیو ناحەزیی ناو کۆمەڵ بنبڕ بکات.

هەمان کات ئێرازمۆس فەرمانڕەوایانی ئەورووپای هاندەدا هـەوڵ بـدەن لای گـەل خۆیـان خۆشەوسـت بکـەن. لێـرەدا ئێرازمـۆس بەتـەواوەتی لـە ئەرکـەکانی قۆنـاغ تێگەیشتبوو, بـە تایبـەتی ئەگـەر لـە یادمـان بێـت ئەوسـاکە لـە سەرانسـەری جیهانـدا میرێك نەبوو, وەك ئەو دەیویست, دڵ نەرم و لەسەرخۆو گەل پەروەرو وەزیرەکانیشـی وەك خـۆی پیـاوی دانسـقەو لێهـاتوو, هـەموویان شـارەزای کـون و کەلەبـەری نیشـتمان بن[153].

هـەر لەبـەر ئـەوە ئیرازمۆسـی رۆتـەردامی بایـەخی زۆری دەدا بـە خوێنـدن و خوێندەواری، خوێندەواری بەلایەو باشترین هۆی پەروەردەکردنی دروستی بیروهۆشـی مرۆیە، بۆیە بەشێك لە نووسینەکانی بۆ باسی پەروەردە تەرخان کردووەو پەردەی لـە ڕووی ناتەواییە زۆرەکانی شێوازی خوێندنی قۆناغی دەرەبەگی لاداوەو گەلێك هێرشـی بردۆتـە سـەر دارکـاریکردنی قوتـابیو جـۆری دەرس وتنـەوەی مامۆسـتایان و داوای لێکردوون هەوڵ بدەن مەبەستەکانیان بە جۆرێکی ڕوون و بێ پێچ و پەنا بگەیێننـە قووڵایی دەروونی شاگردەکانیانەوە.

ئیرازمـۆس لـە تـەوس و گاڵتـە پێکردنـەوە باسـی مامۆسـتایانی رۆژگـاری خـۆی کردووە. لە یەکێك لە شاکارەکانیدا نووسیویە و دەڵێ:

"هەمووان دەزانن.. ئەو مامۆستایانە هەڵدەگرن نـەك ڕۆژی پێـنج وچـانی وەك ئـەلیادەی (هـۆمیرۆس – ك.م) ، بەڵکـە ڕۆژی پێـنج سـەدجار بـەر لـە عنـەت خـرێن لەسـەر جـۆری بـیرو قوتابخانـە بۆگەنـەکانیان. قوتابخانـەن یـان بەندیخانـە، یاکارگـەو قەسابخانەن و بۆ قۆتابیان دانراون؟ چـەند پـیر بـن، بـێ بـەلابن، هێنـد کـەر دەبـن، وا دەزانـن کـەس بـە قولەپێیانـدا ناگـات، بـەناو پۆلەکانـدا وەك کەڵەشـێر دێـن و دەچـن، کوێرانە بەو دووسەرە واوەی دەیزانن دەکەونە گیانی جۆراوجۆری باس و بابەت.. بڕوا بفەرموون ئەوەی ئەوان دەیزانن پولێکی قەڵب ناهێنێ![154].

---

[153] Rabb and J.E. Seigel. Princetion, 1969 pp. 20-21.

[154] دەقی وەرگێڕانـی ئـەو نـاوە "ستایشـی کـەرایَتی"یـە، بـەلام پـێم وایـە بـەکوردی نـاوازی "ستایشـی کەران" خۆشتر دێتە گوێ بۆیەکا ئەو وردە دەسکارییەم لەناوەکەیدا کرد. نووسەرانی عەرەب نـاوی ئـەو کتێبەیان کردۆتە "تمجيد السفاهة" یا "مدح الحماقة" یا "الثناو على الطيش". شایانی باسە مامۆسـتای

واش بوو، کڵێسه کارێکی ئەوتۆی کردبوو مامۆستایانی قۆناغی دەرەبەگی تەنها لە مەیدانی ئاین و فەلسەفەدا شتێکی کەم بزانن، هەرچی بۆنی زانستی نوێی لێ بهاتایە نەدەبوو ئەوان توخنی بکەون، فێرگەکان نیمچە بەندینخانەیەك بوون بۆخۆیان و ئینجا لەگەڵ ئەوەش تەنها منداڵانی چین و دەستەکانی سەرەوەی کۆمەڵ بۆیان هەبوو روویان تێبکەن، کەواتە رزگارکردنی خوێندن و خوێندەواری لە کۆت و زنجیرە قەبەکانی سەدە ناوەنجییەکان یەکێك بووە لەئەرکە گرنگەکانی سەرشانی رووناکبیران. ئیرازمۆس دەیگوت ئەرکی نموونەیی سەرشانی ئەدیبی لێهاتووی کاری بێ وچانە بۆ نەهێشتنی نەزانی کە بەدەردی کوشندەی کۆمەڵ و هۆی ناتەواوییەکانی دادەنا.

ئیرازمۆس بۆخۆی وەك پیاوێکی زیرەك و لێهاتوو مامۆستایەکی بەرز پشتی قوتابی و شاگردو هاوەڵەکانی بوو، بە پێشکەوتنیان گەشەی دەکرد، واتە نموونەی زانای رەسەن بوو نەك ئەوانەی پێشکەوتنی قوتابی و هاورێکانیان خورپەی لە دڵیان هەڵدەساندو رووی گرژ دەکردن، ئەوانەی, ناشکوری نەبن, لای‌خۆشمان کەم نین! . بەدڵسۆزی ، نەك لە پێناوی پارەو پوولدا یان بۆ مەبەستی تر، "کتێبی جوانکاری" و چەند بەرهەمێکی تری بە فێرگەکان دانا، چاپی یەکەمی "کتێبی جوانکاری" ساڵی 1529 بڵاو کرایەوە لەماوەی بیست ساڵدا چل جار چاپ کرایەوە.

بەهەمان دەستوور ئیرازمۆس بایەخی زۆری بە رابردوو دەدا، رۆژگاری کۆنی رۆمان و گرێکی بەرز دەنرخاند، وەك گوتمان زمانی هەردوو لایانی دەزانی، هەروەها لە رێگەی چەند بەرهەمێکییەوە زیاتر سەرنجی رووناکبیرانی رۆژگاری رێنیسانس‌ی بۆ دەسکەوتە گەورەکانی ئەو قۆناغە گرنگەی ئەوروپا راکێشا، بەهادارترینی بەرهەمەکانی ئیرازمۆسی رۆتەردامی لەو مەیدانەدا ئەو شاکارەیەتی کە ساڵی 1500 بەناوی "کتێبی پەندی پێشینان"وە بڵاوی کردەوە[155] . لە چاپی یەکەمی ئەو کتێبەیدا 800 پەندی هەڵبژاردەی گرێکی لەگەڵ لێکدانەوەو لێدوانی قووڵی خۆیدا

---

بەرێزو هاورێو برای خۆشەویستم دکتۆر عبدالقادر احمد الیوسف ئەو شاکارەی ئیرازموسی کردۆتە عەرەبی‌و هێشتا بڵاوی نەکردۆتەوە. بۆ باسی ئەو بەرهەمەی ئیرازمۆس کەڵکم لەدەستنووسەکەی ئەویش وەرگرتووە.

[155] Adagia

بلاو کردەوە کە ڕووناکبیرانی ئەورووپا یەکسەر قۆستیانەوە. ئەوەی وای لە ئیرازمۆس کرد چەند جارێك چاپی بکاتەوەو هەر جارەش کۆلێك پەندی دانسقەی نوێی بخاتە سەر تا بەر لە کۆچی دواییکردنی ژمارەی ئەو پەندانەی ناو کتێبەکەی خۆی دا لەچەند هەزارێك، ئەو بەرهەمەی ئیرازمۆس تەنها لە ژیانی خۆیدا 60 جار چاپ کرایەوە و کرایە ئینگلیزیو فەرنسەییو ئیتالیاییو ئەلمانی و هۆلەندەیی.

دلسۆزیی ئیرازمۆس بۆ ئاینی عیسایی خستییە سەر ڕێگەی لێکدانەوەی ئینجیل و وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی لاتینی، لەو کارەیدا ئیرازمۆس وەستاییەکی بێ هاوتای نواند، ئینجیلی وەها ڕەوان، کردە لاتینی کە خوێندەواران بە ئاسانی بتوانن لە ناوەرۆکی تێ بگەن، لەکاتێکدا وەرگێرانەکانی بەر لەو، وشك و ڕەق و ناتەواو بوون. ئە م کارە و لێدوانەکانی تری ئیرازمۆس خۆی کارێکی ئەوتۆیان کرد ڕووناکبیرانی ئەوسای ئەورووپا باشتر لە ئاینی عیسایی بگەن و بزانن تا چ ڕادەیەك کلێسە لە ڕێی ڕاست لایداوە و ئاینی کردۆتە داردەستی خزمەتی پاپا و قەشە و ڕەبەنەکان و هۆی کوێرکردنەوەی زەینی زۆربەی گەل.

لەو ڕێگەیەوە ئیرازمۆس بێ ئەوەی بۆ خۆی بیەوێ بووە هۆی گەیینی مەرجە پێویستیەکانی تەقینەوەی شۆڕشی گەورەی چاك کردنی ئاین لە ئەرورووپادا کە بەرو دوا قۆناغی ژیانی کەوت. وەك گوتمان ئیرازمۆس لە لایەکەوە ئیماندارێکی دلسۆزو[156] لە لایەکی تریشەوە دژ بە شۆڕش و ئاڵ و گۆڕی کتوپڕ بوو، بۆیەکا نەبووە لایەنگری بزووتنەوە گەورەکەی مارتن لۆتەری بەناوبانگ، بەلکو بە پێچەوانەوە دژیشی وەستاو بە نووسین هێرشی بردەسەر، هەرچەندە سەردارانی ئەو بزووتنەوەی بەدڵ هەوڵیان دا ڕای بکێشنە ناو ڕیزەکانی خۆیانەوە[157] .کە بەراستی جێگەی شیاوی ئەو بوو، هەموان دەیانزانی ئیرازمۆس چۆن بەو ئەوپەڕی دلسۆزییەوە هەوڵ دەدات خۆی وتەنی "خانەی خودا لە نەزانیی بەربەری ڕزگار بکات"[158] .

---

[156] تا دوا هەناسەی ژیانی ئیرازمۆسی ڕۆتەردامی بە دلسۆزی بۆ ئاینی عیسایی مایەوەو خۆی بەسەربازی عیسا دادەناو ساڵی 1504 کتێبێکی بەناوی "پەیامی سەربازی عیسایی "یەوە دانا.

[157] H.G. Koednigsberger and G.L . Mosse , Europ in the sixteenth Century , London , 19068, p103

[158] ئەو ڕستەیەی لە کتێبی "میری عیسایی"دا گووتووە.

لـه هـەمان کاتـدا دوژمنـانی "بزووتنـەوەی چـاککردنی ئـاین" یـش کەسـەربە کلێسـەی کـاتۆلیکی بـوون گـەلێك هـەولیان دا ئیرازمـۆس راکێشـنە نـاو ریزەکـانی خۆیانەوەو چەند پایەیەکی بەرزیان بۆ پێشنیارکرد، بـەلام ئـەو هـەموو جارێـك یـەك وەلامی دەدانەوە "دەمەوێ شیرێکی بێ قەلغان و ئازاد بم!". دەبێ سەرنجی ئەو وەلامە بەرزە لەو قوزبنەشەوە بدەین کە ئیرازمۆس بەشی زۆری ژیانی بەنـەداری و دەست کورتی بردەسەر.

دیسان ئیرازمـۆس بـێ ئـەوەی بۆخـۆی بییـەوێ لـە رێگـەی ژمارەیـەك بەرهـەمی تریـەوە گـەورەترین خزمـەتی پێشکەش بـە بزووتنـەوەی شۆڕشـگێڕانەی چـاککردنی ئاین کرد[159]. لەو بەرهەمانەیدا بە شێوازێکی رازاوەی پڕ لە تەوس و توانج گالتە بەو پیاوە ئاینییانە دەکات کە لە هەموو بازارێکدا زۆر هەرزان خۆیـان دەفرۆشـن، ئەوانـەی لـە خۆیـان و گیرفانیـان بـەولاوە بیرلـە هیچـی ترناکەنـەوە و داردەسـتی کاریشـیان، بەداخـەوە ، ئاینـە. کـەم کـەس وەك ئیرازمۆسـی رۆتـەردامی توانیویـە وێنـەی قەشـە ورگنـە گـوپ هەلاوسـاوە سـوور هەلگـەڕاوەکانمان لەسـەر تـەختی برسـێتی هـەژاران بـۆ بکێشێ. ئەو قەشانەی خۆی وتەنی "زیانیان لە قازانجیان زیـاترە" ئەوانـەی "بەمـەی تـاوانی خـەلکی لـەناو ورگیانـدا دەتوێننـەوە" و بـە " نوشـتە تـاوان رەوێنـە بـێ فەرەکانیان" گیرفانیان دەئاخنن و ئنجا لەگەل ئەوەش هەریەکەیان وای نیـازە بـەخۆی و تـەزبیح و ریشـی درێژیـەوە بێتـە دەسـتە ڕاسـتی عیسـای پێغەمبـەر! جـا ئەگـەر کـەرێتی و سـادەیی خـەلکی نەبوایـە کلێسـە چـۆن خـۆی پـێ رادەگـیرا.؟! بـەو جـۆرە پرسیارانە ئێرازمۆس رووناکبیرانی دەهەژاندو هۆشی دەهێنایەوە بە بەریانا.

ئەو جۆرە وێنانە زۆرجار لە "ستایشی کەران" دا بەرچاو دەکەون. "ستایشی کەران" بەزرترین شاکاری ئیرازمۆسی نەمرە[160]. کە پاشبەندی ئـەدەبیی رۆژنامـەی "تایمس" ی بەناوبانگی لەندەنی پاش پتر لە چوار سەدە ناوی

" نارنجۆکی رێنیسانسی ئاینی" لێناوە.

---

[159] گەلێك زاناو مێژوونووس بزووتنەوەی چاککردنی ئـایین (حرکە الإصلاح الدیني) کە سـەرەتای سەدەی شازدەمین لە ئەوروپادا تەقییەوە بەشۆڕش دادەنێن.

[160] The Paraise of Folly

کـەم بەرهـەمی نووسـەرە کەڵـەکانی رۆژگـاری رێنیسـانس بـەرادەی (ستایشـی کەران) دەنگی داوەتـەوە، رەنگبـێ لێـرەدا ئەوەنـدە بـەس بـێ بڵێین "ستایشـی کـەران" تەنها لەژیانی خاوەنیدا چل دانە جار لەسەر یەك چاپکرایەوەو بەدەیان هـەزار دانـەی بەهەرچوار قورنەی ئەوروپادا بڵاوکرایەوەو بەدەستوبرد گۆڕدرایە سەر دوازدە زمـانی زینـدووی ئـەو کیشـوەرە. سـەنگی ئـەو ژمارانـە لەتـەرازووی ئەوسـای جیهانـدا یـەکجار قورسـە، بەتایبـەتی ئەگـەر ئـەوەیش لـەیاد نەکـەین کەچاپی نـوێ هێشتا کۆرپەیـەکی لەخـەم نەرەخسـیوو بـوو، رووناکبیرو کۆلکـە خوێنـدەوار لەشاراندا بەپەنجەی دەست دەژمێـــردران. وەك دەگێڕنـــەوە بەدەگمـــەن خوێنـــدەوارێکی ئـــەوروپایی هـــەبوو بەپەرۆشەوە "ستایشی کەران"ی نەخوێندبێتەوە. تەنانەت پاپایان جۆلیۆسی دووەمو لیـۆی دەیـەمیش ئـەو بەرهەمـەی ئیرازمۆسـیان لەبەرگـەوە تابـەرگی خوێندۆتـەوەو سەربەقوڕ لەگەڵ ناوەرۆکیدا پێکەنیون[161] بێگومان ئەگەر "ستایشی کـەران" دڵسـۆزانە بـــیرازی دەردەکـــانی کۆمـــەڵی نەکردایـــە هەڵبـــەت روونـــاکبیران وا بەگـــەرمیی نەیاندەقۆستەوە.

ئێرازمۆس ساڵی 1509 "ستایشی کەران"ی داناوە، وەك خۆی دەڵێ بەحـەوت رۆژ تەواوی کردووە. هەرچـەندە کـەرێتی کـەران وای لـەئێرازمۆس کـرد ئـەو شـاکارەی بنووسێ کەبریتیە لەسکالایەکی رەوا لەدەست نەفامان، بەڵام لەهەمان کاتـدا نـاوەرۆکی ئەوەش دەگەیێنێ کەگۆڕینی دەوروبـەری پـڕ گێـلو بـەخیلو چاوبرسـیو خۆپەرسـت کـاری رۆژو دوو رۆژ نییـە. راسـتە رەخنـەکانی ئێرازمـۆس رەقو جـەرگبڕن، بـەڵام عـەودالی رێگـەی راسـتو رەوان بـوو کـەپێی وابـوو رەخنـە تونـدو تیـژ مرۆڤیـان دەگـەیێنێتێ. پێویسـتە ئـەوەیش بڵـێین کەلەگـەڵ هەرسـهێنانی رژێمـی دەرەبـەگیو سەردەرهێنانی سەرمایەداریی کێشەکانی کۆمەڵ لەجاران زیاتر بوون. رەنگبـێ ئـەوەی کەژمارەی پارێزەران لەرۆژئاوای ئەوروپای ئەوسادا بەجۆرێکی هەست پێکـراو پـەرەی سـەند باشـترین بەڵگـە بـێ بـۆ پـێ سـەلماندنی ئـەو راسـتییە. ئێرازمـوس دوای دانـانی "ستایشی کەران" بەنزیکەی یازدە ساڵ لەنامەیەکیدا کەبۆ یـەکێك لـەهاورێکانی خـۆی نووسیوە دەڵێ:

E.S Crosby, Reformation and the Reformers, Amesterdam, 1963,p.82 [161]

